# ووتەی نووسەر

زۆر جار دەوترێت کە کوردیش هیچی کەمتر نییە لەمێژوو و زمان و چاند (کەلتوور و ڕۆشەنبیری) کەچی کە تاکێکی کورد دێتە سەر ئینتەرنێت تووشی نامۆیی دەبێت لەسەر زمانی کوردی بەوەی کە دەبینێت ئەو زمانە لە دواهەمینەکانە ئەوەش بێگوومان هۆکاری خۆیی هەیە بەوەی زۆرێک لە کوردانی ئینتەرنێت بەشێوەی ناتەندرووست هۆگری ڕایەڵەی کۆمەڵایەتیی و سەکۆ یان یانە بێسوودەکان و لاوەکییەکان بوونە ئەوەش کاریگەری هەیە لەسەر ئەو زمانە کوردییە کە زۆرێک پێیان وایە بێکێشەیە و دەبێت پارێزگاری لێبکرێت و تەنانەت هەندێک لە شاعیران وایان بەسەر زمانی کوردی داوتووە کەزمانەکە شەڕەفمانە! لێرەدا من ناچمە نێو بنج و بنەمای ئەدەبییەوە بەڵام ئەو زمانە کە تاکوو ئێستا نەبۆتە هۆکارێک کە من بەئاسانی لەنێو ئینتەرنێتدا زانیاریم پێبگات یان لە پەرتووکخانەکاندا پەرتووکی نازانستی و بێهوودە زۆربوونە کە منی خوێنەر لەدەستییان دا ڕادەکەم! بەرحاڵ ئێمە لێرەدا ناچینە نێو ڕەخنەی زمانی کوردی باسەکەی ئێمە دوورکەوتەوە ، لێرەدا ئێمە باسی ماک دەکەین کە سیستمێکی کارگێرییە ئەوەی منی هاندا کە لەسەر بنووسم ئەو زمانە کوردییە هەژارە بوو کەتاکوو ئێستا نیو پەڕی نییە لەسەر ماک! و بگرە لەسەر چەندان پرسی گرینگتریش لەسەر ماک ئەوەش بێگوومان گەر بۆ کات و ڕۆژگار لێی گەڕێین ئەوا تا نەوەیەکی تریش وەک نەوەی ئێمە هاوکێشە (هەمان کێشە نەک هاوکێشەی بیرکاری!) دەبن هەر بۆیەش ئێمە دەبێت لە ئێستاوە هەوڵ بدەین و تێبکۆشین بەو مەبەستەی نەوەی ئایندە سوودی لێببینێت وەک ئێمە ڕەخنە لەزمانی کوردی نەگرێت و کۆتایی بەو پێشەکییە دێنین بە ڕستەیەک لەناو وەسیەتەکەی قازی مەحەممەد (سەرۆکی کۆماری مەهاباد) بۆ کوردان دەهێنم لەساتەوەختی لەسێدارەدانی

""بخوێنن تا لەکاروانی گەلان دانەبڕێن!""

ئەو ووتەیە هەروەک ئەو ئامانجەی ئێمەی لێدێت کە ئەو ناملیکەیەی پێ نووسرا

""بنووسن تا لەکاروانی گەلان دانەبڕێن""

--مەحەممەد سەردار

١٩ی ئازاری ٢٠١٣--- ٢٩ی ڕەشەمێی ٢٧١٢

تێبینییەک:ئەم پەرتووکە لە ١٩ ی ئازاری ٢٠١٣ دوایین گۆڕانکارییەکانی بۆ کراوە ، لەدوای ئەو ڕۆژەوە هەر گۆڕانکارییەک لە ماک بکرێت ئەوا لە وەشانەکانی داهاتوو دێتە نووسین یان لە ماڵپەڕ بڵاودەکرێتەوە

# دەستپێک

سیستەمی کارگێری (Operating System) کۆمەڵێک بەرنامەی بنەڕەتییە کە کۆمپیوتەر ئەخاتە گەڕ. واتە زاڵ ئەبێ بەسەر ڕەقەواڵەکانی کۆمپیوتەرەکە و ڕاژەگەلێکی هاوبەش دابین ئەکا بۆ ئەپلیکەیشن. سیستەمی کارگێری گرنگترین جۆری نەرمەواڵای سیستەم لە کۆمپیوتەردا. بەکارهێنەر ناتوانێ بەبێ سیستەمێکی بەکارخەری هیچ ئەپلیکەیشنێک لەسەر کۆمپیوتەرەکەی بگەڕێنێ، مەگەر ئەوەی کە ئەپلیکەیشنەکە خۆبووت بێ. (١)

**سیستەمی کارگێری ماک :** لەلایەن کۆمپانیای ئەپڵ پەرەی پێدەدرێت، هەموو ئامێرەکانی ماکینتۆش ئەم سیستەمەیان لەسەر دامەزرێنراوە ، لە ساڵی ١٩٨٦ یەکەمینجار ئەم سیستەمە بەکارخرا و لە دەستپێکدا بەناوی ماک ئۆ ئێس (Mac OS ) بوو دوایی لە ساڵی ٢٠٠١وە کرا بە ماک ئۆ ئێس ئێکس (Mac OSX) وەدوایش ناوی ماکیان لێکردەوە ئەوەش لەدوای وەشانی ٨,١٠ یاخوود شێری شاخەکە کرا وواتا ئێستا بەناوی (OSX) دەناسرێت، ئۆ ئێس ئێکس یەکێکە لە خێزانەکانی یونیکس.

**ماکینتۆش:** زنجیرەیەکە پێک هاتووە لە چەند هێڵێک بۆ کۆمپیوتەرە کەسیەکاننەخشەسازی و پێشکەوتنی لەلایەن کۆمپانیای ئەپڵەوە بۆ کراوە یەکەم ماکینتۆش بەرهەم هێنرا لە ٢٤ی کانوونی دووەم ١٩٨٤ ئەمەش یەکەم ئەزموونی سەرکەوتوو بوو کە بۆ کۆمپیوتەرە کەسیەکان کرا جگە لە مشک (ماوس) و تەختەکلیل (کیبۆرد) کۆمپانیاکە بەردەوام بوو لە سەرکەوتنە یەک لە دوای یەکەکانی بۆ نیوەی دووەمی ساڵی هەشتاکان لە ساڵی نەوەدەکانش وردە وردە بەرەو کاڵبوونەوە و نەمان ڕۆشت وەکو مارکێتی کۆمپیوتەرە کەسییەکان ، پاشان بەرەو ڕووی"Wintel" ی "IBM PC compatible " ڕۆشت ئامێرەکانیشی کارا و چالاک بوون لەگەڵ-MS " DOS"و( "Microsoft Windows" مایکرۆسۆفت ویندۆز (٢)

چەند ساڵێک دوای ئەوە **کۆمپانیای ئەپڵ** بە نموونەی جۆراوجۆر هێنرایە بەردەستی کڕیاران لەلایەن ئای ماک لە ساڵی ١٩٩٨ لە پێشدا پارچەکان جیاواز و جووداو بوون بەڵام پێشکەوتنیان بەسەر هێنا بە کۆکردنەوەیان بۆ ئامێرێک. ئەم بەرەو پێشچوونەش سەلمێنرا بە سەرکەوتنێکی تری ماکینتۆش. ئەم نموونە بەرچاوانە رووبەڕووی ماڵان و ناوەندی فێرکردن و کەسە پرۆفیشناڵەکان کرایەوە. ماک ئاسانە بۆ بەکارهێنان و جوانە لە دیزایندا و بەهێزە و ستایلێکی جوانی هەیە، هەموو ماکە تازەکان زۆر دابەزێنران لەگەڵ"Mac OS X" ی سیستەمی کارگێری کە دیزاین و درووستکردنی لەلایەن کۆمپانیای ئەپڵ هاوکاری کراوە.

**ماک یان مەک :** لە ڕێنووسی کوردی ناوەندی (سۆرانی) کە لە هەردوو پارچەی کوردستان (ڕۆژهەڵات و باشوور) بەکاری دێنن بە جیا ناوی ئەم سیستەمە دەبەن ، کوردی ڕۆژهەڵات مەک بەکاردەهێنن و کوردی باشوور ماک بەکاردێنن لەنووسین و قسەکردندا ئەمەش ڕەنگە زیاتر زمانە نزیککان کاریانی تێکردبێت کە فارسی لە ڕۆژهەڵات و عەرەبی لە باشوور بەرحاڵ ئێمە لەو پەرتووکەدا ماک بەکاردێنین تاکوو ئەوڕۆژەی زمانی یەکگرتوویی یان ستانداردمان دەبێت!

پەراویزەکان--

(١) و(٢) - ویکیپیدیای کوردی - ckb.wikipedia.org

# ماکینتۆشەکان

**ماکبووک پرۆ :** یەکێکە لە بەرهەمەکانی کۆمپانیای ئەپڵ و لە کۆمەڵەی کۆمپیوتەرە لاپتۆپەکانی ماکینتۆش . بۆ یەکەم جار لە مانگی ١ی ٢٠٠٦ لەلایەن کۆمپانیای ئەپڵەوە ڕاگەیەنرا. (١) , دوابەدوای ماکبووک پرۆ ئەپڵ ماک بووک پرۆی بە تایبەتمەندی شاشەی ڕێتینا بڵاوکردەوە کە تایبەتمەندیەکی بەرزی هەیە لەڕووی کوالیتی شاشەکەی

**ماک پرۆ :** کۆمپیوتەرێک وێستکەی کارە (workstation) کە بەخێراترین کۆمپیوتەری کەسییەکان دادەنرێت کە ئەپڵ دەریکردبێت لەنێو ماکینتۆشەکان کە یەکەم دەرچووی لەساڵی ٢٠٠٦ بووە و لەئێستادا ئەپڵ زیادە بایەخ بە ماک پرۆ نادات ئەمەش لەوەتەی ٢٠٠٩ وە دەریناهێنێت، وەهەروەها جگە لە ماک پرۆش ماک پرۆ سێرڤەریش هەبوو کە تایبەت مەندییەکانی لەو ئەو باشتر بوو.

**ئای ماک**: یەکێکە لە کۆمپیوتەرە ماکینتۆشەکان لە کۆمەڵەی کۆمپیوتەرە دێسکتۆپەکانی ماکینتۆش .یەکێکە لە بەرهەمە بەنرخەکانی کۆمپانیای ئەپڵ دوایین دەرچووی ئای ماک بە هەردوو شێوەی سیستەمی (Intel Core i5) وCore i7) دەست دەکەوێت ، ئای ماک وەک هەموو ماکینتۆشەکانی دیکە بەسیستەمی کارگێری ماک ئۆ ئێس کاردەکات کە سیستەمێکە لەلایەن کۆمپانیای ئەپڵ بەرهەم دەهێنرێت (٢)

**ماکبووک ئێر :** ماکینتۆشێکە لەلایەن کۆمپانیای ئەپڵەوە دەردەچێت لە بواری کۆمپیوتەرە لاپتۆپەکاندا. سەر بە کۆمەڵەی لاپتۆپەکانی ماکینتۆشە ، وە هەروەها ئەم کۆمپیوتەرە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی تەنکییەکەیەتی کە تەنانەت جێی (DVD) دی ڤی دی شیان بۆ نەکردووە. ، وەهەروەها ئەم کۆمپیوتەرە بەسیستەمی کارگێری ماک ئۆ ئێس کار دەکات.

**ماک مینی:** یەکێکە لە بەرهەمەکانی کۆمپانیای ئەپڵ بۆ کۆمپیوتەری دیسکتۆپ. ماک مینی نزیکەی ٧,٧ ئینچ دەبێت و کێشەکەی یەک کیلۆگرامە. سیستەمی کارگێری ماک ئۆ ئێسە و پیویستی بە مۆنیتەرە و جا ئەو شاشە و تەختەکلیل و مشکێکە (ماوس) بەرهەمی هەر کۆمپانیایەک بێت پاڵپشتی دەکا. سەرەتا مەک مینی وردەپێواژۆکارەکانی (مایکرۆپرۆسێسەر) PowerPC G4 بەکار دەهێنا دوایی پەنای بۆ ئینتێل برد و بەردەوامیشە , وەهەروەها ماک مینی سێرڤەریش هەیە کەتوانانی زۆرتری هەیە لە ماک مینی!



(وێنەی خێزانی ماکینتۆش)

**پەراویزەکان--**

(٢) – (٣) ویکیپیدیای کوردی ckb.wikipediaorg

# وەشانەکانی Mac OS X کەدوایی کرا بە OS X

1) **Public Beta: "Kodiak"**
2) **Version 10.0: "Cheetah"**
3) **Version 10.1: "Puma"**
4) **Version 10.2: "Jaguar"**
5) **Version 10.3: "Panther"**
6) **Version 10.4: "Tiger"**
7) **Version 10.5: "Leopard"**
8) **Version 10.6: "Snow Leopard"**
9) **Version 10.7: "Lion"**
10) **Version 10.8: "Mountain Lion"**



لۆگۆی دواین وەشانی ئۆ ئێس ئێکس ناسراو بە شێری شاخەکە کەلەو وەشانییەوە ناوی ماک لەسیستەمە کارگێڕییەکەی ئەپڵ لێکرایەوە.

# لە ویندۆزەوە بۆ ماک

لەبەر ئەوەی لە ئێستادا بەگشتی ڕۆژهەڵاتی ناوبین (ناوەراست) بەکارهێنەری ویندۆز زێدەترە لە ماک ئەوەش کایگەری بەسەر بەکارهێنەری کورد کردووە کە لەکاتی بەکارهێنانی ماک تووشی هەندی گۆرانکاری دەبێت کە لای ئەو گۆرانکارییە تووشی سەرسوورمانی دەکات! و زۆرجاریش دەبێتە هۆی وازهێنان لەماک! بۆ ئەم مەبەستەش ئێمە ناوی ئەو زاراوانەمان نووسیوە کە بەخەیاڵمان هاتووە لە ماک بەناوێکن وە لە ویندۆزیش بەناوێکی ترن! (١)

| زاراوەکە لە ویندۆزد | زاراوەکە لە ماک ئۆ ئێس OSX |
|---|---|
| Start Menu (vist &7) | Apple Menu , lunch pad |
| System try | Top right corner of menu bar (system and third part icons) |
| Recycle bin | Trash |
| Start Screen (Win8) | Lunchpad |
| File Exploar | Finder |
| Taskbar | Docks |
| Documents | Home Folder |
| Flip 3D (vist &7) | MissionControl |
| Gadgets and sidebar (vist &7) | Dashboard |
| Priview Pane | Quick Look |
| Search (vist &7)<br>Search charm (win8) | Spotlight |
| Control Panel (vist &7)<br>Settings Charm (win8) | System preferences |

| | |
|---|---|
| iWork , Microsft office for mac | **Microsoft Office** |
| System preferences > Print & scan | **Printer Settings** |
| Time Machine | **Back up and restore center (vista&7)**<br><br>**File History (win8)** |
| Help Menu | **Help** |

وێنەیەکی ڕوونتر کەبەشێک لە زاراوەکانی سەرەوە نیشان دەدات! (٢)




**پەراوێزەکان--**

(١) تەواوی زاراوکان سوود لە پەرتووکی Mac Basics (Super Guide) وەرگیراوە کە لەنووسینی خاتوو (Serenity Caldwell) کە لە ئەپڵیکەیشنی iBook بەدەست دەکەوێت بۆ کرینی یان خوێندنەوەی بەشێکی ( Sample) . (کە بۆ ئای ئۆ ئێس و ماک دەگونجێت)

(٢) وێنەکە لەماڵپەڕ macsfit.com وەرگیراوە!

# ئەپڵیکەیشن Application

ماک ئەپ ستۆر : **ماک ئەپ ستۆر** یان **بازاڕگای نەرمەکاڵاکانی ماک** بریتیە لە دابەشکارێکی دیگیتاڵی و خزمەتگوازیەکی کۆمپانیای ئەپڵ بۆ بەکارهێنەرانی بۆ داگرتنی نەمەکاڵای تایبەت ، بەشێک لەو نەمەکاڵایانە بە خۆراین و ئەوەی تریش بەپارەیە و بەکارهێنەرانی دەتوانن لە ڕێگای هەژماری بانک بیکڕن ، ئەم خزمەتگوازریەی ئەپڵ تایبەتە بەسیستەمی کارپێکەری ماک ئۆ ئێس ی وەشانی ١٠,٦,٦ بەرەو سەرەوە ، ئەم خزمەتگوزاریە لە ٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١١ ەوە بۆ بەکارهێنەرانی ماکینتۆش بەردەست کراوە.



(لۆگۆی ماک ئەپ ستۆر)




وێنەی ڕووکاری ماک ئەپ ستور لەوەشانێکی شێری شاخەکە Mountain Lion

# ئەپڵیکەیشن Application

لێرەدا بە کورتی باسی چەند ئەپلیکەیشنێکی ناو ماک ئەپ ستۆر دەکەین کە خودی ئەپڵ بەرهەمی هێناون.

## کۆمەڵەی ئەپڵیکەیشنی iWork

iWork: زنجیرە ئەپلیکەیشنێکە وەک ئۆفیسی مایکرۆسۆفت بەڵام لەڕووی کارکردن جیاوازن ، iWork پێکدێت لە سێ ئەپلیکەیشن ، جگە لە ماک iWork بۆ سیستەمی کارگێری ئای ئۆ ئێسیش بەدەست دەکەوێت لە App Store

١)Pages: یەکێکە لە ئەپڵیکەشنەکانی iWork کە لەبەرهەمەکانی کۆمپانیای ئەپڵە بۆ کاری نووسین بەکاردێت لەگەڵ چەندین تایبەت مەندی تر ، وە پاڵپشتی لە پەڕگەی DOC, PDF دەکات ، لەشێوەی وۆردی مایکرۆسۆفت دەچێت.



٢)Numbers: یەکێکە لە ئەپڵیکەشنەکانی iWork کە لەبەرهەمەکانی کۆمپانیای ئەپڵە بۆ کاری ژمارە و ژمێریاری  بەکاردێت لەگەڵ چەندین تایبەت مەندی تر ، لەشێوەی ئەکسڵی مایکرۆسۆفت دەچێت!



۳)keynote: یەکێکە لە ئەپڵیکەشنەکانی iWork کە لەبەرهەمەکانی کۆمپانیای ئەپڵە بۆ کاری نووسین و ئامادەکردنی پریسێنتەیشن بەکاردێت لەگەڵ چەندین تایبەت مەندی تر ، لەشێوەی پاوەرپۆینتی مایکرۆسۆفت دەچێت!



---

# کۆمەڵەی ئەپڵیکەیشنی iLife

iLife: زنجیرە ئەپلیکەیشنێکە کە پێکدێت لە ٥ ئەپلیکەیشن کە ئەمانەن iPhoto, iMovie, iDVD, Garage Band- وە iWeb بەڵام لە ئێستادا هەردوو ئەپڵیکەیشنی iWeb و iDVD چیتر دەرناچن! ئەوەی دووەمیان لەبەر ئەوەی چیتر ئەپڵ دیڤیدی لە ماکینتۆشەکان دانانێت! وە زۆربەی ئەپڵیکەیشنەکان لە سیستەمی کارگێری ئای ئۆ ئێس هەن لە App Store

## iLife و بەکارهێنانی

۱)iWeb: ئەم ئەپڵیکەیشنە بەکاردەهات بۆ داڕشتنی وێب کە بۆ سازکردنی ماڵپەری تاکەکەسی یان وێبلاگ بەکاردەهات کە دوایین وەشانی لە ٢٠ ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٠ دەرچوو کە وەشانی ١١ ی بوو لەدوای ئەمە ئەپڵ وەستاوە و چیتر نوێیناکاتەوە



٢)GrageBand : بەکاردێت بۆ دروستکردنی دەنگ و میوزیک



٣)iPhoto : بەکاردێت دەستکاریکردن و پیشاندان و چاپکردنی وێنەیە وەتوانای هەیە بۆ بڵاوکردنەوەشی لە ڕایەڵە کۆمەڵایەتییەکان ، یەکەم وەشانیشی لەساڵی ٢٠٠٢ بوو



٤)iDVD : بەکاردێت بۆ سووتاندن (Burn)ی دیفیدی بەیارمەتی پەڕگەکانی ئەپڵیکەیشنی Quick Time



٥)iMovie : بەکاردێت بۆ مۆنتاژکردن و پرین و دانانی دەنگ و کاری دەستکاری ڤیدیۆیی ، یەکەم وەشانی لەساڵی ١٩٩٩ بوو.

